# فێڵی شەیتان

## لە دوژمنەکانی الرحمن

## وە ئەولیاکانی جهم بن صفوان

لە وەرگرتنی عەقیدەی کوفریان
لە فەلسەفەی ئیغریق و یۆنان

إبن حجر الهیتمي بە نموونە


**عبدالملك الأثري**



١٤٤٥هـ


(زنجیرەی چقڵی چاو و دڕکی قوڕگی بەرگێریکاران لە ئەشعەریە جەهمیەکان : ٣)

وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ

**سوره الاعراف آيه : ١٦٤**

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و تەحریف کردنی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات و پێشخستنی عەقیدەی کەلامی کوفری بەسەر کەلامی الله و کەلامی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ

عەقڵێکی سەلیم و تەسلیمبوو هەرگیز دژی نەقڵی سەحیح ناوەستێتەوە، پێشخستنی عەقڵ بەسەر نەقڵدا یەکەم دەرگای زەندەقە و مولحید بوونە، تەواوی فیرقە کەلامیە کوفریەکان لە جەهمی و موعتەزیلی و کوللابی و کەررامی و ئەشعەری و ماتوریدیەکان هەر بەهۆی ئەمەوەیە کە لە دین دەرچوون، چونکە ئەگەر تەنها یەک شت لە دین ڕەت بکەیتەوە یان لە یەک شتدا عەقڵی خۆتت پێشخست بەسەر ئەو نەقڵە سەحیحانەی هاتووە ئەوە بێگومان توشی زەندەقە و کوفر ئەبیت، چونکە ئەوە هەنگاوی یەکەمی شەیتانە و دواتر هێندە کوفرت پێ ئەکات ڕۆژێک لە ڕۆژان بیرت نەئەکردەوە بگەیت پێی .

یەکەم کۆمەڵ که عەقڵی پێش خست بەسەر نەقڵدا جەهمی و موعتەزیلیەکان بوون، بەڵام پێش ئەوە با بزانین پێناسەی عەقڵ چییە لای ئەوان؟

بێگومان ئەوەی شارەزای عەقیدەیان بێت ئەزانێت که ئەو کافرانه عەقیدەی کوفری خۆیان لەسەر بەناو عیلمی کەلامی کوفری دامەزراندووە.

بۆ ناسینی الله تعالى وازیان له قورئان و فەرموودە هێنا و ڕۆشتن قسەی ئەرستۆ و ئەفلاتون یان کرد به یاسا و پێوەر، پاشان عەقیدەی کەلامی کوفری خۆیان لەسەر فەلسەفەی یۆنان و هیند دامەزراند و خۆیان کوفری تریان بۆ زیاد کرد.

جا عەقڵ لەلای هەموو کۆمەڵەکانی جەهمیەت و ئیلحاد واته بەناو عیلمی کوفری کەلام، واته که عەقڵ پێش ئەخەن بەسەر نەقڵدا ئەوە بەناو عیلمی کوفری کەلام پێش ئەخەن بەسەر کەلامی الله تعالى و کەلامی پێغەمبەرەکەی ﷺ، وه ئەگەر نەقڵی سەحیح لەگەڵ مێشکه پووچەکەیاندا نەگونجێت ئەوە مانای نەقڵه سەحیحەکه ئەگۆڕن به

شێوەیەک لەگەڵ عەقڵە بۆگەنەیەکاندا بگونجێت، واتە تەحریف ئەکەن
.

یەکێکی تر لەو بەهیلاکچووانەی کە تووشی ئەم کوفرە بووە إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري ە .

لە چەندین شوێنی کتێبەکانیدا بە ڕوون و ئاشکرایی دژی قورئان و فەرموودە ئەوەستێتەوە، جا یان ئەڵێت زەعیفە و زۆر زەخت لە خۆی ئەکات بە بەلاوازدانانی ڕیوایەتەکان، یاخود تەحریفی واتای ئایەت و فەرموودەکان ئەکات، هەر بۆیە لە کتێبەکانیدا ئەم سیفاتانە پەکئەخات : (العلو، اليمين، الأصابع، النور، الصورة، الكلام، القرب، النزول، المحبة، الرحمة، الغضب و چەندین سیفاتی تر . . . ) .

تەماشای ئەم ئیلحاد و کوفرە بکە کە الهيتمي تێکەوتووە، بە جوانی لێی ڕابمێنە:

١ - لە **المنح المكية (٨٦٨/٢)** ئەڵێت : (حوکمی عەقڵ *قطعي ە، ئەو عەقیدەیەی پشتی پێ بەستبێت سەحیحە ئەگەر چی نەص یش لەبارەیەوە نەهاتبێت، بگرە ئەگەر نەص بە خیلافی عەقڵ هات واجبە تەئویل بکرێت، وەکو ئایەت و فەرموودەکانی سیفات، چونکە

ڕووکەشەکەی مەحاڵە بۆ اللە، هەر بۆیە واجبە لەسەر ڕووکەشەکەی لابرێت بۆ تەئویلێک کە موافقی عەقڵە) .

* قطعي : واتە بڕاوەتەوە و سەد لە سەد ڕاستی و حەقە .

تەماشاکە ئەڵێت : (بگرە ئەگەر نەص بە خیلافی عەقڵ هات واجبە تەئویل بکرێت، وەکو ئایەت و فەرموودەکانی سیفات، چونکە ڕووکەشەکەی مەحاڵە بۆ اللە، هەر بۆیە واجبە لەسەر ڕووکەشەکەی لابرێت بۆ تەئویلێک کە موافقی عەقڵە) چەندین جار وتومانە ئەشعەریە جەهمیەکان یەکەمجار تەشبیهـ ئەکەن، پاشان دێن تەحریفی ئایەتەکان ئەکەن بەهۆی ئەو تەشبیهەی کردوویانە بۆ ئایەت و فەرموودەکانی سیفات، هەربۆیە دوو جار کەوتوونەتە کوفرەوە .

ئەمە دەرگای هەموو کوفر و زەندەقەیەکە کە ئەهلی کوفریی کەلام کردیانەوە بەڕووی خەڵکیدا هەتا چۆنیان بووێت دینی اللە تعالی بەو شێوەیە تەحریف بکەن .

ئەمە ڕێگایە بۆ عەلمانیەکان هەتا بڵێن نەصەکانی قورئان و فەرموودە بۆ ئەمڕۆ گونجاو نییە و ئەبێت بە شێوەیەک لێکی بدەینەوە لەگەڵ واقیعی ئەمڕۆدا بگوونجێت!

وە ڕێگایە بۆ زانستپەرستەکان هەتا قورئان و فەرموودە بەو شێوەیە لێک بدەنەوە کە لەگەڵ زانستدا بگوونجێت بەو بیانوەی زانست سەلماوە و ڕاستە .

ڕێگایە بۆ حیزبە بەناو ئیسلامیەکان هەتا شیرک بکەن بە تەوحید و بڕۆنە دیموکراسیەت و پەرلەمانەوە و نەصەکانی جیهاد و تێکۆشان بەو شێوەیە لێکبدەنەوە لەگەڵ هەوا و ئارەزووی قێزەونی خۆیاندا ئەگونجێت .

پێش خستنی عەقڵ بەسەر نەقڵدا و تەئویل کردنی نەقڵ بۆلای عەقڵ یەکەم و کۆتا دەرگای کوفرە کە هەر کەسێک لێوەی بڕواتە ناوی ئیللا بە جەهمیەت و زەندەقە و کوفر و شیرکەوە لەو سەری دەرگاکەوە دێتە دەر .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و هاوارکردن لە رسول الله ﷺ بە مەبەستی نزیککردنەوەی لە الله تعالى و گەیاندی داواکانیان پێی

الإستغاثة بریتیە لە داواکردن لە الله تعالى بۆ لابردنی ناخۆشیەک، یان چارەسەرکردنی کێشەیەک، یاخود بۆ بەهاناوەهاتن و هەر شتێکی تری لەوجۆرە، ئەم جۆرە عیبادەتە وەکو هەموو عیبادەتەکانی تر تایبەتە بە الله عز وجل و نابێت بۆ هیچ کەسێک سەرف بکرێت ئەگەر تەنانەت رسول الله ش بێت ﷺ، هەر کەسێک ئەم عیبادەتە سەرف بکات بۆ بێجگە لە الله تعالى موشریکە .

وەکو ئاشکرایە کاری گۆڕپەرستەکان لە هاوارکردن لە رسول الله دا ﷺ نەماوە، بەڵکو هاوار ئەکەن لە شێخە گۆڕبەگۆڕبووە موشریکەکانی خۆیان، ئەگەر بینیبێتتان لە ڤیدیۆیەکدا جاسم کەرکوکی ئیمامی جەهەنەمی و بانگەشەکاری جەهمیەت و گۆڕپەرستی ئەڵێت : (ئێمە پێمان وایە هاوار کردن لە شێخ عبدالقادری گەیلانی هاوارکردنە لە خوا)

!، ئەم کوفرەیان لە ئیمامی گۆڕپەرست و جەهمیان إبن حجر الهیتمي سەرچاوەی گرتووە .

**٢** - ئیمامە قەبرپەرستەکەیان لە کتێبی **(الجواهر المنظم - ص ٦٢)** ئەڵێت : (الإستغاثة بریتیە لە داواکردنی یارمەتی، وە کەسی داواکەر داوا لە داوالێکراو ئەکات بۆ ئەوەی یارمەتی بۆ بەدەست بهێنێت لە بێجگە لە خۆیەوە) پاشان إبن حجر هەمان ئەو قسەیە ئەکات کە جاسم ئەیکات : (لەڕاستیدا ئەو کەسەی کە داوای لێکراوە الله یە، وە پێغەمبەر واسیتەیەکە لە نێوان ئەو و کەسی داواکار) پاشان ئەڵێت : (پێغەمبەر داوالێکراوە) .

ئەم قسەیەی واتە : (داواکردن لە رسول الله داواکردنە لە خودی الله تعالی، چونکە رسول الله واسیتەیەکە لە نێوان الله تعالی و بەندەکانی، هەربۆیە داواکانمان بە الله تعالی ئەگەیەنێت) .

گۆڕپەرستەکانی ئێستاش کە داوا لە شێخە موشریکەکانیان ئەکەن ئەڵێن ئێمە خۆ داوا لە ئەوان ناکەین بەڵکو ئەوان بۆمان ئەگەیەنن بە الله .

ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتە بکەین ئەبینین ئەو ئیشەی الهیتمي و گۆڕپەرستەکانی ئەمڕۆ ئەیکەن هەمان ئیشی عەرەبە موشریکەکانی جاهیلیەتە :

| **مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ** : نایانپەرستین تەنها بۆ ئەوە نەبێت لە الله نزیکمان بکەنەوە | (الزمر : ٣) .

گۆڕپەرستەکانیش ئەچن عیبادەتێک کە تایبەتە بە الله عز وجل ئەیدەن بە رسول الله ﷺ ، بۆ ئەوەی رسول الله ﷺ داواکانیان بە الله تعالی بگەیەنێت .

هەرکەسێک ئەوکارە ئەنجام بدات کافر و موشریکە، وە إبن حجر الهیتمي لەپاڵ ئەمەشدا خاوەنی چەندین کوفری ترە .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و بابەتی شد الرحال

- (شد الرحال) واتە بڕینی مەسافەیەک ڕێگا بۆ گەیشتن بە شوێنێک بە مەبەستی نزیکبوونەوە و عیبادەت .

فەرموودەی سەریح و سەحیحی رسول الله ﷺ هاتووە لە (الصحيحين) دا ئەفەرمووێت : (شد الرحال نییە تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت، المسجد الحرام، وە ئەم مزگەوتەم، وە المسجد الأقصى) .

لێرەدا رسول الله ﷺ ئاماژە بەوە ئەدات کە موسوڵمان ئەتوانێت بە تایبەتی بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە الله تعالى و عیبادەت بڕوات بۆ کەعبە، یان مزگەوتی نەبەوی لە مەدینە، یاخود مزگەوتی الأقصى لە قودس .

بە مانایەکی تر ئەو سێ مزگەوتە تایبەتن، تەنها ئەو سێ مزگەوتە ئەتوانرێت بە تایبەتی سەفەری بۆ بکرێت .

یەک نوێژ لە کەعبە بە سەد هەزار نوێژی ئاساییە، وە یەک نوێژ لە مسجد النبوي بە هەزار نوێژ و لە مسجد الأقصی بە پێنسەد نوێژە .

بیدعە و گومڕایی ئەشعەریە جەهمیە گۆڕپەستەکانی وەکو إبن حجر الهیتمي ئەوەیە کە ئەڵێن موستەحەب و سوننەتە کە شد الرحال بکەیت تەنها بۆلای قەبری رسول الله ﷺ ، لەکاتێکدا هیچ بەڵگەیەکیان پێ نییە لەوبارەیەوە، بەڵکو هەندێ بەڵگەی قورئانی گشتی و موجمەل ئەهێننەوە و تایبەتی ئەکەن بە قەبری رسول الله ﷺ ، لەکاتێکدا ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە و تەفسیری سەلەف ئەوە بە هیچ شێوەیەک یەکناگرێتەوە لەگەڵ ئەو تەحریفاتانەی ئەوان بۆی ئەکەن .

- إبن حجر الهیتمي پێی وایە کە شد الرحال تەنها بۆ قەبری رسول الله ﷺ کارێکی موستەحەب و سوننەتە، وە لەم بارەیەوە دوو کتێبی نووسیوە دژی ئەو کەسانەی شد الرحال بۆ قەبری رسول الله ﷺ بە حەرام و بیدعە ئەزانن .

عەقیدەی قەبر پەرستی ئەشعەریە جەهمیەکان کاریگەریەکی زۆری هەبووە بەسەر ئەو بابەتە فیقهیانەی کە پەیوەندی قەبر ـەوە هەیە، هەر ئەوەشە کە وا لە إبن حجر ئەکات لە کتێبی **(الجوهر المنظم)** بڵێت کە درۆ

بکات و بڵێت زۆربەی زانایانی خەلەف و سەلەف شد الرحال تەنها بۆلای قەبری رسول الله ﷺ بە سوننەت ئەزانن .

وە کاری إبن حجر ئەگاتە ئەوەی لە هەمان کتێبدا بڵێت زیارەتکردنی قەبری ئەولیاکان نزیکبوونەوەیە و موستەحەبە، وە بەهەمان شێوە شد الرحال بۆلای .

وە لە کۆتاییدا کاری ئەگات بە گومڕادانی ئەوانەی کە شد الرحال بۆلای قەبری رسول الله ﷺ بە سوننەت نازانن .

- إبن تيمية لە **(الرد على الإخنائي)** دەربارەی شد الرحال بە تایبەتی بۆلای قەبری رسول الله ﷺ ئەڵێت : (هیچکام لە زانایانی موسوڵمان نەیانوتووە کە سەفەرکردن بۆلای واجبە، وە نەزانراوە وتبێتیان موستەحەبە، بەڵکو سەلەف و پێشین لەسەر بەحەرامدانانی بوون) .

وە لە هەمان کتێبدا ئەڵێت کە سەلەف ئیجماعیان هەیە لەسەر حەرامبوونی شد الرحال بە تەنها بۆلای قەبری رسول الله ﷺ، وە هەر کەسێکیش ئەوە بداتە پاڵیان ئەوە بە بێگومان درۆی کردووە .

جائیزە کەسێک بڕوات بۆ مسجد النبوي لە مەدینە و لەوێش سەردانی قەبری رسول الله ﷺ بکات، بەڵام سەلەف ئەوەیان بە حەرام زانیوە کەسێک سەفەر بکات تەنها بۆلای قەبری رسول الله ﷺ .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و تەوەسول کردن

التوسل : طلب الوسيلة، واتە داواکردنی نزیکبوونەوە و شەفاعەت، بە مانایەکی تر واتە نزیکبوونەوە لە اللە بە وەسیلە و ڕێگایەک .

- دوو جۆر تەوەسول هەیە، بەشێکی جائیز و شەرعیە کە بریتیە لە نزیکبوونەوە لە اللە تعالی بە وەسیلەیەکی شەرعی .

بۆ نمونە :

١ - نزیک بوونەوە لە اللە تعالی لە ڕێگەی ناو و سیفاتەکانی، واتە لە دوعاکانتدا بڵێیت یا اللە لەبەر خاتری گەورەیی خۆت یان بۆخاتری ناوە جوانەکانت لە فڵانە کار یارمەتیم بدە .

٢ - نزیک بوونەوە لە اللە تعالی لەڕێگەی کار و کردەوەیەک کە لەپێناو ئەودا کردووتە، بۆ نمونە جارێک خۆت زۆر پێویستت بە پارە بووە بەڵام لەپێناو اللە تعالی بەخشیوتە، لە دوعاکەتەدا ئەڵێیت یا اللە لەبەر ئەو

پارەیەی کە کردم بە خێر لەکاتێکدا خۆم زۆرم پێویست بوو فڵانە کارم بۆ ئاسان بکە .

٣ - نزیک بوونەوە لە الله تعالی لە ڕێگەی دوعاکردنی کەسێکی زیندوو و ئامادە بۆت، بۆ نمونە کەسێکی زۆر باش و لەخواترس و ئەهلی سوننە ئەناسیت و پێی ئەڵێیت دوعام بۆ بکە الله تعالی فڵانە شتم پێ بدات .

- دووەم جۆری تەوەسول کە یان بیدعەیە یاخود شیرک بریتیە لە هەوڵدان بۆ نزیکبوونەوە لە الله تعالی بەڕێگەیەک کە جائیز نییە .

بۆ نمونە :

١ - نزیک بوونەوە لە الله تعالی لەڕێگەی داواکردن لە کەسێکی مردوو، ئەمە شیرکە، ئەمەش بریتیە لەوەی داوا لە کەسێکی مردوو یان غائیب بکەیت بۆ ئەوەی نزیکت بکاتەوە لە الله تعالی .

٢ - نزیکبوونەوە لە الله تعالی لەبەر پێگە و پلە و پایە و جاهـ ی کەسێک یان شتێک لەلای الله تعالی کە ئەمەش بیدعەیە، بۆ نمونە بڵێیت یا الله لەبەر پیرۆزی کەعبە کارم بۆ ئاسان بکەیت .

إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري ئەو دوو جۆرەی تەوەسول کە یەکێکیان بیدعەیە و ئەوی تریشیان شیرکە بە موستەحەب یان ئەزانێت .

**٣ -** لە کتێبی **(الجوهر المنظم)** ئەڵێت کە (تەوەسول کردن بە رسول الله جائیزە لە پێش دروست کرانی و لە دنیا و پاش مردن و لە قیامەتیشدا) .

دەربارەی ئەو تەوەسولەی کە بە موستەحەبی ئەزانێت ئەڵێت : (تەوەسول کردن پێی واتە داواکردنی دوعا لێی ﷺ) یان (دوعاکردن بە جاهـ و پێگە و پلەی) .

لێرەدا إبن حجر هەر سێ جۆرەکەی تێکەڵ کردووە، واتە جائیز و کوفر و بیدعەکەی یەکسان کردووە بە یەک .

کاتێک لە پێناسەی تەوەسولدا ئەڵێت : (تەوەسول کردن پێی واتە داواکردنی دوعا لێی ﷺ) لەکاتی ژیانی رسول الله ﷺ و قیامەتدا ئەوە جائیزە، بەڵام لە کاتی پێش خەلق کردنی یان دوای وەفاتی ئەوە شیرکە .

وە کاتێک لە پێناسەی تەوەسولدا ئەڵێت : (دوعاکردن بە جاهـ و پێگە و پلەی) لە ئەو چوار حاڵەتەی باسی کردووە بیدعەیە .

هەر بۆیە لەم بابەتەشدا وەکو سێ چوار بابەتی پێشتر کەوتووەتە ناو کوفر و شیرک و بیدعەوە .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي درۆ كردن بە دەمی سەلەفەوە

سەلەف رحمهم الله لە بابەتی سیفاتی الله عز وجل دا عەقیدەیان بریتی بووە لە : جێگیرکردنی مانای ئەو سیفەتەی لە ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکاندا هاتووە، بەبێ تەشبیہ کردنی بە سیفاتی مەخلوقەکان، وە بەبێ گۆڕینی مانەکەی و لادانی لەسەر ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکە، وە بەبێ دیاریکردنی چۆنیەتی سیفەتەکە، واتە سەلەف رحمهم الله ئەزانن واتای سیفەتەکانی الله تعالی چییە، وە ماناکە جێگیر ئەکەن، بەڵام نازانن سیفەتەکە چۆنە .

هەر کەسێک کتێبەکانی سەلەف بخوێنێتەوە ئەزانێت کە چەندە توووند بوون لەسەر ئەو کەسانەی مانای ئایەت و فەرموودەکانی سیفاتیان گۆڕیوە و مانای ڕووکەشیان جێگیر نەکردووە .

چەندین جار باسمان لەوە کردووە کە ئەشعەریە جەهمیەکان ڕووکەشی قورئان و فەرموودە بە هیدایەت و ڕێگەی ڕزگار بوون نازانن، بەڵکو بە ڕێگەی کوفر و شیرک و تەشبیھ و تەجسیم و گومڕایی ئەزانن .

پاش ئەوەی بەم شێوەیە بیریان کردەوە لە قورئان و فەرموودە ڕۆشتن لەسەر ئەساسی بەناو عیلمی کوفری کەلام عەقیدەی خۆیان بنیاتنا، پاشان قورئان و فەرموودەیان دا لە قاڵبی بەناو عیلمی کەلامی کوفری، هەتا وای لێھات ئەو کوفرانەی خۆیان دایانهێنابوو کردیان بە حاکم بەسەر وتەی الله عز وجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ .

بە کورتی و پوختی حەقیقەتی عەقیدەکەیان ئەوەیە کە پێیان وایە قورئان و فەرموودە مایەی هیدایەت نییە، بەڵکو مایەی سەرلێشێواوی و تەشبیھ و کوفرە، لەگەڵ ئەوەشدا پێیان وایە بەناو عیلمی کەلام کە خۆی ئەبینێتەوە لە کۆمەڵە یاسایەکەی فەلسەفی کوفری مایەی هیدایەت و دڵنیاییە .

بەم شێوەیە گەورەترین تاوانیان ئەنجامداوە چونکە بە قسەی ئەوان بێت الله تعالى پێغەمبەری ﷺ ناردووە هەتا خەڵکی فێری کوفر و تەشبیھ بکات نەوەک تەوحید .

بەگوێرەی ئەو عەقیدەی کوفریەی ئەوان بێت قورئان و فەرموودە زەرەر ئەگەیەنن بە خودی موسوڵمانان لەجیاتی ئەوەی بۆیان ببێت بە مایەی هیدایەت .

ئەم زەندیقانە ڕێگەیان خۆش کرد بۆ زەندیقەکانی تر هەتا بە دڵی خۆیان بێن تەحریفی واتای ئایەت و فەرموودەکان بکەن لە هەر بابەتێک خۆیان پێیان خۆش بێت .

**٤ -** إبن حجر الهیتمي الأشعري الجهمي لە کتێبەکانی **(الفتاوی الحدیثیة ص ١١٧، أشرف الوسائل ص ٢٣٢، شرح المشکاة ص ١٣٤، غرز المواعظ ص ٨ وە المنح المکیة)** ئاماژە بەوە ئەدات لە بابەتی سیفاتی اللە عز وجل دا دوو مەنهەجی ڕاست هەیە، یەکێکیان مەنهەجی سەلەفە کە بریتیە لە تفویض کردنی واتای سیفەتەکانی اللە و لەگەڵ ئەوەشدا ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکان مەبەست نییە، مەنهەجی دووەم هی خەلەفە کە بریتیە لە گۆڕینی واتای سیفەتەکان و تەحریف کردنیان .

- وە لە چەندین شوێنی کتێبەکانیدا ئەڵێت : (منهج السلف هو الأسلم، و منهج الخلف هو الأعلم والأحکم) ! .

ئەمە حەقیقەتی مەنهەجی سەلەفە لەلای ئەشعەریە جەهمیەکان، کوفر و پەکخستنیان لێ بووە بە عەقیدەی سەلەف .

کاتێک ئەوترێت بەناو زانایەکی ئەشعەری زەندیق وازی لە عەقیدەی کوفریەکەی خۆی هێناوە و گەڕاوەتەوە سەر عەقیدەی سەلەف ئەوە بزانە لە کوفرێکەوە چووەتە سەر کوفرێکی تر، لە تەحریفکردنی ئایەت و فەرموودەکانەوە چووەتەسەر جێگیر نەکردنی ڕووکەشی ئایەتەکان بەجاهیل دانانی رسول الله ﷺ و هاوەڵان و هەموو سەلەف .

ئەشعەریەکان لە دوو گومڕایی دان :

١ - تەئویلی سیفات .

٢ - وائەزانن مەنهەجی سەلەف تەفویز بووە .

بۆیە هیچ ئەشعەریەک لە تەئویلی سیفاتدا ووتەکانی ناداتە پاڵ سەلەف چونکە نابینین یەک زانای سەلەف تەئویلی کردبێ چ جای ببێتە مەنهەجی سەلەف، ئەشعەریەکان ئەڵێن: مەنهەجی سەلەف بریتیە لە تەفویز، واتا وتوویانە ئەوەی هاتووە لە قورئان و سوننەت ئیسباتی ئەکەین بەڵام نازانین مانای دان چیە، نازانین دەست چیە نازانین چاو چیە

نازانین نزول چیە ... هتد، بۆیە ئەبینین ئەڵێن: (منهج السلف أسلم، ومنهج الخلف أعلم) واتا مەنهەجی سەلەف سەلامەتتر بووە لە سیفات وتوویانە ماناکەی نازانین و قسەی تیادا ناکەین، خۆیان نەخستۆتە لێکدانەوەی مانای سیفاتەکان و تەئویل کردن، بەڵام مەنهەجی ئێمە زاناترە، ئێمە مانای سیفەتەکانمان لێک داوەتەوە وتوومانە دەست واتا قودرەت، نزول واتا دابەزینی رەحمەت، استوی واتا استولی ... هتد، بەڵام سەلەف سەلامەتیان هەڵبژاردووە هیچیان نەووتوە.

جا ئەمە دوو گومڕاییە :

یەکەمیان کە لە مەنهەجی سەلەف لایانداوە خۆشیان دانی پێ ئەنێن و ئەڵێن سەلەف بێ دەنگ بوونە و سەلامەت بوونە، بەڵام ئێمە قسەمان کردووە لە ماناکاندا زاناتر بووین.

دووەمیان مەنهەجی سەلەف بێدەنگ بوون نەبووە بەو مانایەی ئەشعەرییەکان تێی گەیشتوون کە سەلەف نەزانن مانای سیفاتەکان چیە، بەڵکو ماناکەیان ئیسبات کردووە بە حەقیقی دوور لە مەجاز و تەئویل، بەڵام بۆ باسکردنی چۆنیەتی سیفەتەکە بێدەنگ بوونە و نەهیان کردووە قسەی تیادا بکرێ، واتا مەنهەجی سەلەف تەفویزی چۆنیەتی سیفەتەکان بووە، نەک تەفویزی مانای سیفەتەکان، بەڵام

ئەشعەرییەکان وا تێگەیشتوون کە مەنهەجی سەلەف بریتیە لە تەفویزی مانای سیفەتەکان، بۆیە بەشێک لەو ئەشعەریانەی کە ئەووتریێ تەوبەیان کردووە ئەبینی وازیان لە تەئویل هێناوە چوونەتە سەر تەفویز، بۆ ؟ چونکە لە ئەسلدا پێیان وابووە مەنهەجی سەلەف تەفویزە، بۆیە لە دوو گومڕاییدان دوای تەوبە کردنیان لە گومڕایی تەئویل ئەڕۆن بۆ گومڕایی تەفویز، نموونەی ئەمانەش کە ئەووتریێ تەوبەیان کردووە وەک: الجويني والغزالي والرازي وازیان لە تەئویل هێناوە چوونەتە سەر تەفویز، لە کوفرێکەوە بۆ کوفرێکی تر.

ابن حجریش لە کۆتایی فتح الباري لە قسەکانی دیارە کە مەیلی بۆلای تەفویز ئەچێ دوای تەئویل کردنێکی زۆر، چونکە فتح الباري بە ماوەی ٢٥ ساڵ نوسراوە، لەم ماوەیەش گۆڕانکاری بەسەر کەسەکان دێت ئەم کتێبەش هەفتانە هەندێکی لێ نوسراوە و بەسەر قوتابیەکانیدا دابەشی کردووە، وەک باقی کتێبەکانی تر نیە بەیەک پارچە لە ماڵەوە بینوسێ دواتر بیهێنێتە دەرەوە و بڵاوی بکاتەوە، بۆیە ئەبینین لەکۆتایی فتح الباري قسەکەی الجويني نەقل ئەکات و تەئیدی ئەکات کە باس نەکردنی تەئویلی سیفات سەلامەتترە واباشە بێدەنگ بین و قسە لە ماناکەی نەکەین (واتا تەفویزی ماناکەی).

تەفویزیش لای ئەهلی سوننە پیسترە لە تەئویل چونک مانای وایە اللّٰه تعالی بە جۆرێک پەیامی ناردووە بۆ خەڵکی کە کەس لێی تێناگات و نازانێ مانای چیە، هەرچی ووتوە دەربارەی سیفاتەکانی نازانین مانای چیە.

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و نەفیکردنی ئەوەی الله عز وجل لەسەر عەرش بێت

- ئیمام حرب الكرماني له كتاب السنة ئیجماعی ئەو زانایانه نەقڵ ئەکات کە بینیونی ئەڵێت :

**٩٦** - الجهمية : دوژمنی الله ن، ئەوانەن کە پێیان وایە قورئان مخلوق ە، وە پێیان وایە الله قسەی لەگەڵ موسى عليه السلام نەکردووە، وە الله قسە ناکات و نابینرێت، وە شوێن بۆ الله نازانرێت - واتە شوێنی نییە - ، وە الله عەرش و کورسی نییە، وە قسە گەلێکی زۆر کە ڕقم لێیە بیگێڕمەوە، ئەوانە کافر و زەندیقن دوژمنی الله ن ئاگاداریان بە .

**كتاب السنة**

بزانە رحمك الله یەکێک له نیشانەکانی جەهمیە پەکخەرەکان بریتی بووە له نەفیکردنی ئەوەی الله تعالى لەسەر عەرش بەرز بووبێتەوە، واتە نەفی علو ی ذاتي ی الله عز وجل یان کردووە .

لەم بابەتەدا ئەشعەریە جەهمیەکانیش سەد لە سەد شوێنیان کەوتوون، لەڕاستیدا ئەشعەریەکان جەهمی نین، بەڵکو غولاتی جەهمین، واتە لەو جەهمیانەن زیادەڕۆییان کردووە لە کوفر و پەکخستن، وە هەر لە زووەوە تەحریفی ئایەتەکانی علو ی ذات یان کردووە بە علو ی دەسەڵات و قەهر و . . . چونکە پێیان وابووە ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکانی علو کوفر و تەشبیهە .

**٥ -** إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(فتح المبين : ص - ١٢)، (الإنافة في الصدقة والضيافة : ص - ٣٦)، (الزواجر : ١/٣٢)، (الفتاوى الحديثية : ص - ١٥١ و ١٥٣)، (المنح المكية : ٣/١٣٩٧)، (النخب الجليلة : ص - ٤٢)، (شرح المشكاة : ص - ٩٣)، وە (عمدة شرح البردة : ص - ٥١٥)** ئەڵێت کە الله عز وجل شوێنی نییە، وە پاکڕگیراوە لەوەی علو ی ذاتي هەبێت .

تەنها ئەم کوفرە بەسەر بۆ بەجەهمیدانانی إبن حجر و تەکفیرکردنی، لەگەڵ ئەوەشدا بە دەیان کوفر و شیرکی دیکەی لە بابەتەکانی تری سیفات و تەوحیدی ئولوهیەت هەیە، بەڵام سەرەڕای ئەم هەموو زەندیقیەتە هێشتا هەندێک گومڕا و گومڕاکەر ئەڵێن ابن حجر کافر نییە یان جەهمی نییە یاخود لە چەند شتێکدا موافەقەیانی کردووە،

وەک چۆن ابن احجر العسقلاني لە شەرحەکەی بۆ سەحیحی ئیمامی بوخاری زیاتر لە دووسەد شوێندا قسەی جەهمیەکان ئەکات کەچی ئەڵێن لە هەندێ شتدا موافەقەیانی کردووە! بگرە هەیە ئەڵێت هەر ئەشعەری نییە! ئەم جۆرە کەسانە ئەبێت پێداچوونەوەیەک بۆ ئیمانی خۆیان بکەن هەتا بەم عەقیدە بۆگەنەوە نەگەڕێنەوە بۆلای الله تعالی عز وجل و لەگەڵ ئیمامە جەهمیە زەندیقەکانیاندا حەشر نەکرێن .

ئەوەی جێگای سەرسووڕمانە ئەگەر پێیان بڵێیت نەفیکردنی علو یان پەکخستنی ئەوەی الله عز وجل لەسەر عەرشە کوفری گەورەیە یان بچووک؟ ئەوە بێگومان ئەڵێن کوفری گەورەیە، پاشان دێن دژی ئەو کەسانە ئەوەستنەوە کە ئەو کافرانە تەکفیر ئەکەن کە کەوتوونەتە ناو ئەو کوفرە گەورەیەوە! وە پێیان ئەڵێن زیادەڕەو و تەکفیری، یان حەمدانی، ئەو جۆرە کەسانە بە هیچ جۆرێک بە بەڵگە قسەیان لەگەڵ ناکرێت، چونکە دڵیان کوێرە و هیدایەت وەرناگرن مەگەر کەمێکیان نەبێت، تەنها پێیان ئەوترێت : (ئەگەر إبن حجر الهیتمي کافر و موشریک و زەندیق و جەهمی و ئەشعەری نەبوو ئەوە لەعنەتی الله و تەواوی لەعنەتکاران لەسەر من، ئەگەر پێچەوانە بوو ئەوە لەعنەتەکە لەسەر تۆ) .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و پەکخستنی سیفەتەکانی الله عز وجل

لە قورئان و چەندین فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە اللە تعالی سیفەتی (الیمین) واتە دەستی ڕاستی هەیە، سەلەف رحمهم اللە ماناکەیان لەسەر ڕووکەش جێگیر کردووە بەبێ دانانی چۆنیەتی بۆ سیفەتی دەستی ڕاستی اللە عز وجل، وە بەبێ تەحریف کردنی مانای سیفەتەکە، بەڵام هەر لەو کاتەوە جەهمیە پەکخەرەکان تەشبیهی ئەو ئایەت و فەرموودەیانە ئەکەن، پاشان دێن تەحریفی ئەکەن و سیفەتەکە پەک ئەخەن، چونکە پێیان وایە ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکە کوفر و تەشبیهە و مەحاڵە بۆ اللە عز وجل .

٦ - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(الإنافة في الصدقة والضيافة)** تەحریفی واتای سیفەتی الیمین ی اللە عز وجل ئەکات و چونکە وەک خۆی ئەڵێت ڕووکەشی فەرموودەکە مەحاڵە بۆ اللە !

واتە رسول اللە ﷺ بە شتێک وەسفی اللە عز وجل ی کردووە کە مەحاڵە بۆی، وە دواتر بۆ هاوەڵانیشی ڕوون نەکردووەتەوە و هەموو ئوممەت لە گومڕایی و تەشبیهدا بوون هەتا ئەم جەهمیە کافرە زەندیقانە هاتن و وتیان مانای ڕووکەشی قورئان و فەرموودە کوفرە و مەحاڵە لەسەر اللە و لەبەر ئەوە تەحریفیان کردن .

٧ - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(أسنى المطالب)** تەحریفی واتای سیفەتی الأصابع ی اللە عز وجل ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیەکان لە فەرموودەی رسول اللە ﷺ : (دڵی ئیماندار لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دایە . . . ) لەکاتێکدا لەم فەرموودە و چەندین فەرموودەی تردا باسی سیفەتی الأصابع بۆ اللە عز وجل کراوە، بەڵام زەندەقە و جەهمیەت و پەککخستن باڵی بەسەر عەقیدەی الهيتمي دا کێشاوە و تەوحیدی لێ بووە بە کوفر و شیرک، وە کوفر و شیرکی لێ بووە بە تەوحید .

٨ - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(المنح المكية)** ئەڵێت : (صورة ی نییە سبحانە وتعالى هەتا ببینرێت)، واتە نەفی سیفەتی الصورة ئەکات .

**٩ -** وە لە کتێبی **(الفتاوى الحديثية)** دەربارەی فەرموودەی : (إن خلق الله آدم على صورته) ئەڵێت : (کە جێناوی کۆتایی وشەی (صورته) ناگەڕێتەوە بۆ الله، وە **ئەگەر بشگەڕێتەوە ئەوە ئیللا ئەبێت تەحریفی بکرێت لەسەر مەنهەجی خەلەف**، بە خیلافی ئەوانەی کە مانای ڕووکەشەکەیان قبووڵ کردووە لەلای زۆرێک لە زانایان تەکفیر کراون) .

بزانە رحمک الله سەلەفی ئوممەت رحمهم الله سیفەتی الصورة یان بۆ الله عز وجل جێگیر کردووە و فەرموودەی : (إن خلق الله آدم على صورته) یان لەسەر ڕووکەش جێگیر کردووە، بەڵام إبن حجر الهيتمي دێت هەموو سەلەف بە کافر و موشەبیهە ئەزانێت و نەفی سیفەتی الصورة ئەکات .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و تەحریف کردن و پەکخستنی سیفاتەکانی الله عز وجل بە تەحریفاتی جەهمیەکان

ئەهلی کوفر و بیدعە بە چەندین شێواز کەوتوونەتە کوفرەوە لە تەحریف کردن و جێگیر نەکردنی حەقیقەتی سیفەتی الكلام (قسەکردن) ی الله تعالى .

هەر لە سەرەتاوە جەهمی و موعتەزیلەکان وتیان قورئان کەلامی الله یە و مخلوقە، لەسەر ئەوە و چەندین کوفری دیکە لەلایەن سەلەفەوە تەکفیرکران و بە زەندیق دانران .

پاشان واقیفەکان پەیدا بوون کە هەر جەهمیەکانی پێشتر بوون بەڵام نەیانئەتوانی وەکو سەرەتا عەقیدەی خۆیان ئاشکرا بکەن بڵێن قورئان مخلوق ە، هەربۆیە بە وەقف کردن لە قورئاندا وەستان و وتیان نە ئەڵێین مخلوق ە نە غیر مخلوق، سەلەف رحمهم الله ئەمانیشیان لە

جەهمیەکان هەژمار کرد، وە بگرە بە خراپتر لە جەهمیەکان چونکە قسەکانیان کاریگەری ئەکردە سەر خەڵکی ئاسایی .

پاشان لەفزیەکان پەیدابوون، پێشەوای ئەم فیرقەیە دوو کەسی زەندیق و کافر بوون، الکرابیسي و إبن کلاب، هەردووکیان لەلایەن سەلەفەوە تەکفیر کراون .

الکرابیسي ئەیوت قورئان کەلامی الله و غیر مخلوق ە بەڵام لەفزمان بە قورئان مخلوق ە، إبن کلاب یش هەمان قسەی الکرابیسي ئەکرد بەڵام لەگەڵیدا کوفرێکی تری بۆ زیاد کرد، إبن کلاب وتی کەلامی الله نەفسیە، هەربۆیە حرف و صوت ی لە کەلامی الله عز وجل پەکخست و وتی قورئانەکەی زەوی مخلوق ە .

ئەمانیش لەلایەن سەلەفەوە رحمهم الله بە جەهمی و کافر و زەندیق دانران، هەرچی ئەشعەریە جەهمیە زەنیدیقەکانیشە شوێن کۆتا ڤێرژنی کوفر کەوتوون لە مەسەلەی کەلامی الله عز وجل دا، واتە شوێن إبن کلاب کەوتوون، هەربۆیە لە یەکەم کەسیانەوە کە ئەبو حەسەنی ئەشعەریە هەتا کۆتا کەسیان ئەڵێن کەلامی الله غیر مخلوق ە، بەڵام مەبەستیان کەلامی نەفسیە نەوەک کەلامی حەقیقی، وە پێیان وایە دوو قورئان هەیە، دانەیەکیان مخلوق ە، وە دانەیەکیان مخلوق نییە، وە

ئەڵێن لەفزمان بە قورئان مخلوق ە، الله تعالی ئاگری جەهەننەمیان پێ بگەشێنێتەوە .

**١٠** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(الفتوى الحديثية، التعرف، فتح الإله و تنبيه الأخيار)** دا ئەڵێت الله عز وجل خاوەنی کەلامی نەفسیە، وە ئەو قورئانەی هەیە لەسەر زەوی مخلوق ە، وە کەلامی الله بە حرف و صوت نییە، وە کاتێک الله عز وجل قسەی لەگەڵ پێغەمبەر موسى عليه السلام دا کرد ئەوە موسى کەلامی الله تعالی ی نەبیست، بەڵکو لە دڵیدا تێگەیشتنێکی دروست کرد، وە لە گوێیدا بیستنێکی دروست کرد، واتە بەم جۆرە گوێی لە کەلامی الله عز وجل بووە نەوەک بە حەقیقی .

موعتەزیلە و جەهمیەکانی سەرەتا هاتن بە ئاشکرا وتیان کە الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسی دا نەکردووە، چونکە عەقیدەیان وابوو ئەگەر بڵێن الله قسەی لەگەڵ موسی دا کردووە ئەوە کوفر و تەشبیهیان کردووە، سەلەف رحمهم الله لە کتێبەکانیاندا چەندین باب یان داناوە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسانەی ئەڵێن الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسی دا نەکردووە .

پاشان ئەشعەریە جەهمیەکان هاتن هەمان قسەی جەهمیەکانیان کرد بەس تۆزێک ترش و خوێیان کرد، وتیان الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسی کردووە بەڵام بەبێ دەنگ و پیت ! بەڵکو شتێکی تری دروست کردووە ئەو شتە قسەی لەگەڵ موسی کردووە نەک الله عز وجل .

ئەشعەریە جەهمیەکانیش گەیشتنە هەمان ئەنجامی موعتەزیلە و جەهمیەکانی سەرەتا، لە ئەنجامدا هەردووکیان نەفی قسە کردنی الله عز وجل یان کرد لەگەڵ موسی، جیاوازی نێوانیان ئەوەیە جەهمی و موعتەزیلەکانی سەرەتا بە ئاشکرا وتیان قسەی الله موسی نەکردووە، ئەشعەریە جەهمیەکانیش وتیان با قسەی کردووە، بەڵام خۆی نا بەڵکو شتێکی تری دروست کردووە تا قسە لەگەڵ موسی بکات !

بەڵام سەلەف رحمهم الله هەر سێ کۆمەڵەکەیان بە کافر و زەندیق داناوە و عەقیدەیان وایە الله عز وجل بە حەقیقی قسە لەگەڵ موسی علیه السلام دا کردووە بە حرف و صوت .

**١١** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(فتح الإله و الزواجر، الإيضاح والبيان)** دا تەحریفی سیفەتی النزول ی الله تعالی ئەکات، وە لەسەر ئەساسی عەقیدە کەلامیە کوفریەکەی پێی

وایه الله تعالى مەحاڵە ئەم سیفەتەی هەبێت، ئەڵێت یان ئەبێت تفویض ی واتاکەی بکەین، یاخود تەحریفی بکەین، واته بڵێین ڕەحمەتەکەی دائەبەزێت، وە دووباره نەفی سیفەتی علو ی الله عز وجل ئەکاتەوە له درێژەی نەفیکردنی سیفەتی النزول دا .

سەلەف رحمهم الله له بابەتی سیفەتی النزول دا مانای ڕووکەشی فەرموودەکانیان وەرگرتووە و باوەڕیان پێی هێناوە، ئەوە جەهمیەکانن که سیفەتەکه تەحریف ئەکەن و جێگیرکردنی سیفەتەکه به کوفر و تەشبیه و شیرک ئەزانن .

**١٢** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري له کتێبی **(فتح الإله)** دا تەحریفی سیفەتی القرب ی الله تعالى ئەکات به تەحریفاتی جەهمیەکان، چونکه له ئەسڵدا پێی وایه الله له هیچ شوێنێک نییه، جا ئەگەر الله له هیچ شوێنیک نەبێت چۆن له بەندەکەی نزیک ئەبێتەوە .

بەڵام قورئان و سوننەت و عەقیدەی سەلەف رحمهم الله پڕیەتی له جێگیرکردنی سیفەتی القرب ی الله عز وجل لەسەر مانا حەقیقیەکەی .

**١٣** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري له کتێبی **(فتح الإله)** دا تەحریفی سیفەتی المحبة ی الله تعالى ئەکات به تەحریفاتی

جەهمیەکان، وە ئەڵێت مەحاڵە الله عز وجل بەم سیفەتە وەسف بکرێت، لەکاتێکدا الله عز وجل لە چەندین شوێنی کەلامەکەیدا وەسفی خۆی کردووە بەوەی کە سیفەتی خۆشویستنی هەیە :

| **إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ** | (البقرة : ١٩٥) .

| **قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ** | **(آل عمران :** ٣١) .

ئەو ئایەت و فەرموودە و ئاثارانەی سیفەتی المحبة بۆ الله عز وجل جێگیر ئەکەن هێندە زۆرن لێرەدا باس ناکرێن، بەڵام ئەشعەریە جەهمیە پەکخەرەکان بەهۆی عەقیدە کەلامیە کوفرەکەیانەوە پێیان وایە جێگیرکردنی سیفەتی المحبة لەسەر مانای حەقیقی کوفر و تەشبیهە .

**١٤** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(المنهاج القويم، فتح الجواد، حاشية الإيضاح، المنح المكية و البدائع الجلية)** دا تەحریفی سیفەتی الرحمة ی الله تعالى ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیەکان و پێی وایە مەحاڵە الله عز وجل خاوەنی ئەم سیفەتە بێت، بەڵام سەلەف رحمهم الله ئەم سیفەتەیان جێگیر کردووە بە پشتبەستن بە فەرموودەی سەحیحی رسول الله ﷺ .

**٧٤٠٤** - حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : (لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ - هُوَ يَكْتُبُ عَلَى نَفْسِهِ، وَهْوَ وَضْعٌ عِنْدَهُ عَلَى الْعَرْشِ - إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي).

: رسول الله ﷺ فەرمووی : کاتێک الله دروستکراوەکانی دروست کرد له کتێبەکەی خۆی نووسی - نووسی لەسەر نەفسی خۆی، وە لەلای خۆی دانراوە لەسەر عەرش - بەڕاستی ڕەحمەتم زاڵە بەسەر تووڕەیمدا.

**صحيح البخاري**

- ئەم فەرموودەیە شەش سیفەتی الله تعالی ی لێوە وەرئەگیرێت :

- خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ : سیفەتی دروستکردن (خەلق) .

- كَتَبَ فِي كِتَابِهِ : سیفەتی نووسین .

- عَلَى نَفْسِهِ : سیفەتی نەفس .

- عِنْدَهُ عَلَى الْعَرْشِ : سیفەتی علو، واته الله تعالی لەسەرو حەوت تەبەقەی ئاسمانە لەسەر عەرش .

- رَحْمَتِي : سیفەتی ڕەحمەت .

- غَضَبِي : سیفەتی تووڕەبوون .

بێگومان ئەهلی سوننە و جەماعە ئەم سیفەتانە جێگیر ئەکەن وە باوەڕیان پێی هەیە، وە مانای سیفەتەکان تێئەگەن بەڵام چۆنیەتی سیفەتەکان نازانن بە خیلافی موفەویضەکان، وە نایشوبهێنن بەهیچ شتێک لە دروستکراوەکانی بە خیلافی موشەبیهەکان، وە پەکی ناخەن بە تەحریف و تەئویلی کوفری بە خیلافی جەهمیەکان و ئەشعەریە جەهمیەکان.

**١٥** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(فتح المبين، المنح المكية)** دا تەحریفی سیفەتی الغضب ی الله تعالى ئەکات بە تەحریفاتی جەهمیەکان و پێی وایە مەحاڵە الله عز وجل خاوەنی ئەم سیفەتە بێت، تەماشای فەرموودەکەی سەرەوە بکە بەڵگەی تێدایە .

# دڵۆپێک له دەریای کوفر و گومڕایەکانی إبن حجر الهیتمي الأشعري الجهمي القبوري

عبدالله بن کلاب (٢٤٠ ھ) لەو جەھمیانە بوو کە ئەیانوت لەفزمان بە قورئان مخلوق ە، چونکە إبن کلاب عەقیدەی وابوو الله عز وجل بە حرف و صوت قسە ناکات، بەڵکو کەلامی نەفسی ھەیە، لەسەر ئەم عەقیدەیەش خۆی و شوێنکەوتووەکانی تەکفیرکران لەلایەن سەلەفەوە رحمهم الله .

أبو الحسن الأشعري کە شوێنکەوتەی کوللابیە جەھمیەکانە باسی مەزھەبی ابن کلاب ئەکات کە بڕوای وایە کەلامی الله بێ دەنگ و بێ پیتە، ئەڵێت :

قال عبدالله بن كلاب أن الله سبحانه لم يزل متكلماً وأن كلام الله سبحانه صفة له قائمة به وأنه قديم بكلامه وأن كلامه قائم به كما أن

العلم قائم به والقدرة قائمة به وهو قديم بعلمه وقدرته، وأن الكلام ليس بحروف ولا صوت.

**مقالات الإسلاميين**

پاشان خودی أبو حسن الأشعری و شوێنکەوتووانی هەمان عەقیدەی إبن کلاب یان هەیە .

- ابن منده (**٣٩٥** هـ) ئەڵێت :

مرۆڤ تەقوای الله بکات و عیبرەت وەرگرێ لە پێشینی خۆی لەوانەی کە (لەفز) مەزهەب و ووتەیان بووە، کە چۆن دەرچوون لە دونیا بە هەجر کراوی و زەم کراوی و دەرکراوی لە مەجلیسەکان و شارەکان بەهۆی عەقیدە ناشرینەکەی و ووتە خراپەکەی کە موخالفی دینی الله یە، وەک: الکرابیسی و ابن الشواط و ابن کلاب و ابن الأشعري و هاوشێوەکانیان ئەوانەی کە جیدال کردن و کەلام ڕێبازیان بووە لە دینی الله عز وجل.

**ذم الكلام وأهله**

**١٦** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري له باسکردنی کەلامی الله عز وجل دا لە کتێبی **(فتح المبين - ٧١ )** دا ئەڵێت : (المنزه عن حرف والصوت) وە ئەڵێت : (أرسله على بعض رسله بألفاظ الحادثة) .

لێرەدا بە ئاشکرا دەرئەکەوێت کەلامی الله لەلای ئەشعەریەکی جەهمی وەکو الهيتمي بەبێ حرف و صوت ە، وە لفظ یشی بە قورئان مخلوق و حادث ە .

ئەگەر خۆت گێل بکەیت لە کوفر و تەجەهومەکانی الهيتمي و تەنها دان بەم کوفرەیدا بنێیت ئەوە بەسیەتی بۆ تەکفیرکردنی .

**١٧** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(الفتوى الحديثيه : ٢٣٥ - ٢٣٦)** ئەڵێت کە إبراهيم ی کوڕی پێغەمبەر ﷺ لە منداڵیدا پێغەمبەر بووە .

ئەمە گومڕاییەکی تری الهيتمي يە، لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە إبراهيم ی کوڕی رسول الله ﷺ پێغەمبەر نییە و کەسێکی ئاساییە .

**١٨** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(الزواجر : ١/١٣، فتح المبين : ٧١، الفتوى الحديثية : ١٠١، الإعلام : ٢٢١،**

**التعرف : ١١٧)** دەبارەی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئەڵێت کە : (پارێزراون لە گوناهەکان، لە گەورە و بچووکیان، لەوەی کە بە مەبەست ئەکرێت، وە لەوەی کە بەبێ مەبەست ئەکرێت، پێش پێغەمبەرایەتی و پاش پێغەمبەرایەتی) .

عەقیدەی سەلەف رحمهم الله ئەوەیە کە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام پارێزراون لە هەڵەکردن لە گەیاندنی دیندا، وە پارێزراون لە تاوانە گەورەکان، بەڵام پارێزراو نین لە تاوانی بچووک، لێرەدا الهیتمي موخالەفەی عەقیدەی سەلەفی کردووە بەوەی ئەڵێت تەنانەت لە پێش پێغەمبەراتیش لە گوناهی بچووک پارێزراون .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و باوەڕ بوون بە خورافیات

لەلای هەموو موسوڵمانێک زانراوە کە سۆفیەکانی سەردەم لە خەڵەفاوترینی کەسەکانن، هەر لە بڕوا بوون بە شتی سەیر سەیر و بزمار و گڵۆپ و موس خواردن هەتا باوەڕ بوون بە موقەدەس بوونی شێخە گڵاوەکانیان .

بێگومان بەناو زاناکانیانیش حاڵیان لەوانەی تر باشتر نییە، بگرە هەموو ئەو کوفر و گومڕاییەی تووشی بوون هۆکارێکی سەرەکی بەناو زاناکانیانە .

بگرە ئەو بەناوزانایانەشیان کە خۆیان مەژغوڵ کردووە بە فەرموودە و زانستەکانیەوە نەیاتوانیوە لەژێر کاریگەری بەناو عیلمی کوفری کەلام و خورافیات دەربچن، هەتا وایان لێهات کافربوون بەرامبەر بە الله عز وجل بە کافربوونێک زیاتر لە یەهودی و نەسڕانیەکان .

**١٩** - بۆ نمونە یەکێکی وەکو إبن حجر الهیتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(عمدة شرح البردة، المنح المكية و المولد الشريف)** ئەڵێت کە رسول الله ﷺ لە نور دروست بووە !

لێرەدا بەلامەوە عەیبە بڵێم (عەقیدەی سەلەف رحمهم الله ئەوەیە کە رسول الله ﷺ وەکو ئێمە ئینسانە و بە هیچ شێوەیەک لە نور دروست نەبووە، وەک چۆن خەڵەفاوەکان وا گومان ئەبەن)، چونکە بەڕاستی هەر کەسێک تۆزێک ژیری هەبێت باوەڕ بەو قسەیە ناکات .

لێرەدا گومڕاییەکی تری زیاد کرد بۆ سەر خەرمانی کوفر و جەهمیەت و پەکخستن و گومڕاییەکانی .

**٢٠** - إبن حجر الهیتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(عمدة شرح البردة، المنح المكية و المولد الشريف)** ئەڵێت کە جنۆکەکان و مرۆڤەکان و مەلائیکەکان لەبەر رسول الله ﷺ دروستکراون !

بەڵام ئەم قسە پووچەی الهیتمي دژی چەندین بەڵگەکە لە قورئان و فەرموودە، بۆ نمونە : | **وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ** | (الذاريات: ٥٦) .

﴿ **الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا** ﴾ (الملک : ٢) .

بێگومان رسول الله ﷺ لەلای الله عز وجل خۆشەویسترین کەس و خاوەنی زۆرترین فەزڵە، وە ئەبێت لەلای هەموو موسوڵمونێکیش بەم شێوەیە بێت .

له هەمان کاتدا الله عز وجل ئێمەی لەبەر پەرستنی خۆی دروست کردووە، نەوەک لەبەر رسول الله ﷺ .

**٢١** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري له کتێبەکانی **(أشرف الوسائل، عمدة شرح البردة، المنح المكية و المولد الشريف)** ئەڵێت که دایک و باوکی رسول الله ﷺ زیندوو کراونەتەوە و باوەڕیان بە رسول الله ﷺ هێناوە و ڕزگاریان بووە له سزا، وە هەموو ئەهلی فەترەش ڕزگاریان بووە له سزا .

ئەهلی فەترە ئەوانەن کە له نێوان ژیانی دوو پێغەمبەردا ژیاون و پێغەمبەریان بۆ نەچووە، ئەو کەمینەیەیان کە الله یان بە تاک و تەنها پەرستووە ئەچنە بەهەشتەوە إن شاء الله، وە ئەوانەیان کە موشریک

بوون بەپێی حاڵی خۆیان لە قیامەت یان ئەخرێنە جەهەننەمەوە، ئەمە بۆ ئەوانەی کە دینیان پێ گەیشتووە یان توانای گەڕان بەدوای دینیان هەبووە بەڵام نەگەڕاون، یان لە قیامەت تاقی ئەکرێنەوە، ئەمەش بۆ ئەوانەی کە دینیان پێ نەگەیشتووە یان توانای گەڕانیان نەبووە بەدوای دینە ڕاستەکەتەدا، جا بە هیچ شێوەیەک ناوترێت کە ئەهلی فەترە نەجاتیان بووە لە ئاگر، چونکە بەپێی حاڵیان ئەگۆڕێت وە زۆربەشیان بە موشریکی مردوون .

وە تایبەت بە دایک و باوکی رسول الله ﷺ هەردووکیان بە موشریکی و کافری مردوون، چونکە رسول الله ﷺ وەک چۆن لە **(صحیح مسلم و سنن أبو داود)** دا هاتووە بە پیاوێک ئەفەرمووێت : (باوکی من و باوکی تۆش لە ئاگردان) .

وە وەک چۆن لە **(صحیح مسلم)** دا هاتووە ئەفەرمووێت : (مۆڵەتم وەرگرت لە پەروەدگارم بۆ سەردانکردنی گۆڕی دایکم، وە داوای مۆڵەتم کرد بۆ داواکردنی لێخۆشبوون بۆی بەڵام مۆڵەتی نەدام) .

بە بەڵگەی فەرموودەی صحیح باوکی رسول الله ﷺ لە جەهەننەمدایە، وە دایکی بە موشریکی مردووە .

**٢٢** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(أشرف الوسائل و المنح المكية)** ئەڵێت کە رسول الله ﷺ لە دنیادا لە پاش وەفاتی ئەبینرێت .

ئەگەر رسول الله ﷺ لە دنیادا لەپاش مردنی ببینرایە ئەوە هاوەڵان و پاش ئەوان تابیعین شایەنی ئەوە بوون رسول الله ﷺ ببینن، بەڵام هیچ شتێکی وا لە سەلەفەوە نەهاتووە رحمهم الله، ئەم جۆرە شتانە تەنها لە شێخە گومڕا و گومڕاکەکانی الهيتمي و ئەشعەریە جەهمیەکانەوە هاتووە .

الهيتمي و هەموو ئەشعەریە جەهمیەکان بەحسابی خۆیان پێغەمبەریان ﷺ خۆش ئەوێت بۆیە ئەم کۆمەڵە درۆیەیان داوەتە پاڵی، بەڵام ئەگەر هەر بەڕاستی خۆشیان بوویستایە ئەوە ڕووکەشی فەرموودەکانیان بە کوفر و تەشبیه دانەئەنا، وە مانای ڕووکەشی ئەو قورئانەی هێناویەتی بە کوفر یان دانەئەنا، وە پاشان چەندین بیدعە و لادان لە سوننەت و گومڕاییەکان دانەئەهێنا لە دینەکەدا، بەڵام وەک چۆن لە بابەتی ئەسماء و سیفاتدا تووشی کوفر هاتوون، بە هەمان شێوە

لە بابەتی سوننەت و عیبادەتەکاندا تووشی چەندین کوفر و گومڕایی هاتوون.

## إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري چەند کوفر و گومڕاییەکی

**٢٣ -** إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري له کتێبی **(الفتاوى الحديثية و العمدة شرح البردة)** دەربارەی زیندووبوونەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەڵێت کە مرۆڤ (بە جەستە زیندوو ئەبێتەوە) .

بەڵام عەقیدەی سەلەف رحمهم الله ئەوەیە کە مرۆڤ لە قیامەتدا بە ڕۆح و جەستە زیندوو ئەبنەوە .

إبن تيمية دەربارەی زیندووبوونەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە کتێبی **(الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح)** ئەڵێت :

(خەڵکی سەر زەوی سەبارەت بە زیندووبوونەوە لەسەر چوار وتەن :

(وتەی یەکەم : وتەیەکیان کە مەزهەبی سەلەفی موسوڵمانانە لە هاوەڵان و تابیعیەکان و ئیمامە ناسراوەکانی موسوڵمانان وە بێجگە لەوان

لە ئیمامەکان ئەهلی سوننە، وە سۆفیەکان، وتەیان ئەوەیە کە ڕۆح و جەستە پێکەوە زیندوو ئەبنەوە .

وتەی دووەمیان : وتەی ئەوانەیە کە تەنها زیندووبوونەوەی جەستە جێگیر ئەکەن، وەک چۆن زۆرێک لە موتەکەلیمەکان لە جەهمی و موعتەزیلە بیدعەچییەکان وا ئەڵێن . . . ) .

وەک چۆن کاتێک سەلەف رحمهم الله لەڕووی دەسەڵاتەوە سەرکەوتن بەسەر ئەو جەهمیانەدا کە ئەیانوت قورئان مخلوق ە، پاشان لەبەر دەسەڵاتی ئەهلی سوننە و ئاشکرایی کوفرەکەیان ناچار بوون بە تەوەقوف کردن و مەسەلەی لفظ کوفرەکەیان بشانەوە .

بە هەمان شێوە ئەشعەریە جەهمیەکانیش ناتوانن هەر ئاوا بە سادەیی وتەی جەهمیەکان دووبارە بکەنەوە، بەڵکو دێن چەندین ئەملا و ئەولا ئەکەن و لە ڕووکەش و سەرەتادا وتەی ئەهلی سوننە ئەکەن، بەڵام دوای یەکتۆز ڕوون کردنەوە یان یەکتۆز پێش تەواوکردنی قسەکەیان جەهمیەتی خۆیان دەرئەخەن لعنهم الله لعنة واسعة .

بۆ نمونە جەهمیەکان ئەیانوت اللە عز وجل لەسەر عەرش نییە، وە لەسەر ئەم قسەیەیان تەکفیر کران، جا ئەشعەریە جەهمیەکان نایانەوێت یەکسەر ڕووی ڕەشیان دەربکەوێت، بۆیە دێن هەمان قسە و عەقیدەی جەهمیەکان ئەڵێن بەڵام بە جۆرێکی تر، بۆ نمونە ئەڵێن (اللە عز وجل شوێنی نییە)، یان (اللە عز وجل لەسەر عەرشە، بەڵام بە دەسەڵاتی نەوەک بە ذاتي خۆی) .

ئەمە هەمان قسەی جەهمیەکان و بگرە پیسترە، چونکە گوێگر لە سەرەتادا کە لە ئەشعەریەک ئەبیستێت (اللە تعالی لەسەر عەرشە) وا تێ ئەگات موسوڵمانە، بەڵام دواتر ئەشعەریە جەهمیەکە ئەڵێت (بە دەسەڵاتی نەوەک بە ذاتي خۆی) ئەوکات موسوڵمانەکە تێئەگات کەسی قسەکەر هیچی تر نییە بێجگە لە جەهمیەکی کافری زەندیق .

**٢٤** - وەک چۆن إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(فتح الإله بشرح المشكاة)** لە سەرەتادا ئەڵێت لە بەهەشتدا اللە عز وجل ئەبینرێت و ... کۆمەڵە قسەیەکی تر کە ئەگەر نەیناسیت وا ئەزانیت ئیمام أحمد ە، بەڵام پاشان لە دوو ڕیزی کۆتاییدا ئەڵێت کە (اللە ئەبینن بەڵام بەبێ ئەوە شوێنی هەبێت) .

ئەم قسەیەی کۆتایی تەواوی قسەکانی پێشووی هەڵئەوەشێنێتەوە و زەرپی سفری ئەکات، چونکە قسەکەی نەفی علو ی ذاتي الله تعالى تێدایە، وە لە هەمان کاتیشدا نەفی بینینی الله عز وجل ی تێدایە بەو شێوەیەی کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە، پاشان کە موسوڵمانان باوەڕیان وایە الله عز وجل ئەبینن وا تێئەگەن کە الله لە بەرزایی بێت و ئەمانیش تەماشای بکەن .

**٢٥** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە بابەتی القدر دا خاوەنی چەندین گومڕاییە، هەر لە جەبریەت و کسب و نەفیکردنی تحسين و تقبيح عەقڵی و نەفیکردنی حیکمەت لە کارەکانی الله عز وجل و ...

لەم پۆستەدا پوختەی عەقیدە بۆگەنەکەیان ڕوونکراوەتەوە :

https://t.me/imamakany_kufr/375

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و هەبوونی عەقیدەی جەهمی و مورجیئەکان لە بابەتی ئیماندا

ئیمامی الشافعي رحمه الله ئەڵێت : (ئیجماع ی هاوەڵان و ئەوانەی شوێنیان کەوتوون لەوەی کە ئێمە پێیان گەیشتین ئەوەیە کە : ئیمان وتە و کردار و نیەتە، هیچ یەکێکیان لەوانەی تر جودا ناکرێتەوە) .

ئیمامی البخاري رحمه الله ئەڵێت : (گەیشتم بە زیاتر کە هەزار کەس لە زانایانی وڵاتان، نەمبینی هیچ کامێکیان ڕاجیاوازی هەبێت لەوەی ئیمان وتە و کردارە، وە زیاد و کەم ئەکات) .

**شرح أصول إعتقاد أهل السنة**

بزانە رحمک الله عەقیدەی سەلەف لە بابەتی ئیماندا ئەوەیە کە : (ئیمان = قول و عمل، یان قول و عمل و نیة، یان قول و عمل و نیة و إصابة السنة) یە، ئەم سێ پێناسەیە دەلالەتە لە یەک مەبەست بەڵام بە سێ

شێوازی جیاواز، مەبەستەکەش ئەوەیە کە (ئیمان واتە کار و کردەوە و بەڕاستدانانی دڵ بۆ ئەو شتانەی کە مرۆڤی موسوڵمان پێویستە باوەڕی پێی هەبێت، وە وتنی شەهادە بە زوبان، وە ئەنجامدانی ئەو کار و کردەوەیانەی شەرع فەرمانی پێ کردووە، وە لە هەموو ئەمانەدا نیەتت تەنها و تەنها بۆ الله بێت، وە لەسەر سوننەتی رسول الله ﷺ ئەم کارانە ئەنجام بدەیت) .

وە عەقیدەی مورجیئە گومڕا بیدعەچیەکان ئەوەیە کە ئیمان تەنها قول ە، واتە بەڕاستدانانی دڵ و وتنی بە زمان، مورجیئەکان عمل لە ئیمان ئەکەنە دەرەوە، واتە بە شەرتی دروستێتی ئیمانی نازانن تەنها بە شەرتی کەمال یان بە شرائع ی ئەزانن، لەبەر ئەمە سەلەف رحمهم الله بە توندترین شێوە ڕووبەڕوویان وەستاونەتەوە و تەبدیعیان کردووە .

عەقیدەی جەهمیە کافرەکانیش ئەوەیە کە ئیمان تەنها بەڕاستدانانی دڵە، واتە ئەگەر کەسێکی (بەناو) موسوڵمان جلی جولەکەکان لەبەر بکات و نوێژی جولەکەکان بکات ئەوە نابێت پێی بڵێیت کافر پێش ئەوە بزانیت لە دڵەوە ئەو شتە ئەکات یان نا، یان ئەگەر کەسێک بە پێیەکانی (والعیاذ بالله) بڕواتە سەر قورئان و جوێنی پێ بدات کافر نییە ئەگەر ئەم کارەی لە دڵەوە نەکردبێت، ئەمە عەقیدەی جهم بن

صفوان و بشر المريسي و أبو حسن الأشعري يه لعنهم الله لعنة واسعة، إبن تيمية چەند جارێک ئاماژەی بەو بابەتە کردووه .

ئەشعەریە جەهمیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئیمان بەڕاستدانانی دڵە، وە کۆکن لەسەر ئەوەی کە کار و کردەوە لە شەرائیع و کەمالاتی ئیمانە نەوەک لە خودی ئیمان، وە ڕاجیاوازیان هەیە لە دانپێدانانی زمان دا، هەندێکیان ئەڵێن ئەگەر کەسێک بە زمان شایەتومان نەهێنێت ئەو کافرە، هەندێکی تریشیان ئەڵێن ئەگەر بە زمانیش شایەتومان نەهێنێت هەر موسوڵمانە .

ئەو ڕوونکردنەوەیەی سەرەوە دانەکەیان عەقیدەی جەهمیەکانە، ئەویتریشیان ناکەیت عەقیدەی مورجیئەکانە .

ئەوەی کە ئەڵێت (ئیمان تەنها بەڕاستدانانی دڵە، وە ئەگەر کەسێک بە دەمیش شایەتومان نەهێنێت هەر موسوڵمانە)، ئەمە عەقیدەی جەهمیە کافرەکانە، زۆربەی ئەشعەریەکان لەسەر ئەم عەقیدە بۆگەنەن .

إبن تيمية له **(مجموع فتاوى - ١٢٠/٧)** ئەڵێت : وه ابو الحسن الأشعري قسەکەی جەهمی سەرخست لە بابەتی ئیمان دا، وە قسەکەی

جەهم وتەیەکە هیچ کەس لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە نەیان وتووە، بەڵکو احمد بن حنبل و وکیع و أبو عبید القاسم بن سلام و جگە لەوانیش تەکفیری ئەو کەسەیان کردووە کە قسەکەی جەهمی کردووە کە ابو الحسن یش ئەوەی سەر خستووە، وە لای ئەوان ئەم وتەیە خراپترە لە وتەی مورجیئەکان).

**٢٦** - إبن حجر الهیتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(فتح المبین - ص : ٦٥)** دا ئەڵێت : (لەڕووی شەرعەوە ئیمان تەنها بەڕاستدانانی دڵە).

لێرەدا الهیتمي جەهمی لە بابەتی ئیماندا عەقیدەی جەهمیەکانی هەیە.

**٢٧** - إبن حجر الهیتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبەکانی **(المنح المکیة، تحفة المحتاج، فتح المبین، الفتاوی الحدیثیة و خیرات الحسان)** دا ئەڵێت : (ئەگەر کەسێک واز لە وتنی شایەتومان بهێنێت ئەوە هەر ئەهلی بەهەشتە و کافر نییە و تەنها تاوانێکی کردووە، وەک چۆن الغززالي باسی کردووە).

ئەوەی لێرەدا الهیتمي باسی کردووه لە الغززالي یەوە سەد لە سەد عەقیدەی جەهمیە کافرەکانە، تەنها ئەمە بەسە بۆ تەکفیرکردنی الغززالي .

ئەوەی کە ئەڵێت : (ئیمان بەڕاستدانانی دڵ و دانپێدانانی زمانە، وە کار و کردەوەش شەرائیع و کەمالاتی ئیمانە نەوەک لە خودی ئیمان بێت)، ئەمە قسەی مورجیئە گومڕا و گومڕاکەرەکانە .

ئیمام حرب الکرماني رحمه الله لە کتاب السنة کەیدا کە ئیجماعی زانایان نقڵ ئەکات ئەڵێت : (هەر کەسێک بڵێت ئیمان وتەیە بەبێ کار و کردەوە ئەوە مورجیئەیە، وە هەر کەسێک بڵێت ئیمان وتەیە، وە کار و کردەوە شەرائیع ی ئیمانن ئەوە مورجیئەیە) .

**٢٨ -** إبن حجر الهیتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(التعرف - ص : ١١٧)** دا ئەڵێت : (کار و کردەوەی ئەندامەکان داغڵی ئیمان نابێت، بەڵکو شەرتی کەمالی ئیمانە) .

# إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري و بیدعەی حەسەنە

کاتێک موسوڵمان شوێن سوننەت ئەکەوێت لە خۆیەوە هیچ بیدعەیەک داناهێنێت، چونکە لە حەقیقەتدا ئەم کەسە موسوڵمانە لەسەر ڕێگە و ڕێبازێک ئەڕوات کە هەموو شتەکانی بۆ دیاری و تەواو کراوە .

بە پێچەوانەوە ئەهلی بیدەع هەمیشە لە هێنانە ناوەوەی شتی تازە و نوێن بۆناو دینی ئیسلام، لەکاتێکدا ئەو شتانە بە هیچ جۆرێک لەناو دینەکەدا جێگەی نابێتەوە .

کێشەی سەرەکی بیدعە ئەوەیە کە لە شوێنێکدا ڕاناوەستێت، واتە بەردەوام شتی زیاتر بۆ خودی بیدعەکە زیاد ئەبێت چونکە خۆی بیدعەیە .

وە هیچ کەسێک بیدعەچی نابینیت لە سنوورێکدا بوەستێت لە ئەو بیدعەیەی کە لەسەریەتی، بەڵکو هەمیشە شتی بۆ زیاد ئەکات .

بەڵام موسوڵمانی ئەهلی سوننە وەکو وتمان شوێنکەوتەیە نەوەک داهێنەر، لەسەر ئەوە ئەڕوات کە پێشینانی لەسەری ڕۆیشتوون .

هەمیشە بیدعەچیەکان هەوڵ ئەدەن لە ڕێگەیەک لە ڕێگەکانەوە بیدعەکانیان بخزێننە ناو دین، بێشەرمیان ئەگات بەوەی بڵێن : (ئەزانین بیدعەیە، بەڵام بیدعەیەکی چاکە ! ) .

**٢٩** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري لە کتێبی **(فتح المبين - ص : ١٠٨)** دا بیدعە ئەکات بە دوو بەشەوە، ئەڵێت بەشێکیان بیدعەی حەسەنەن، وە بەشێکیان بیدعەی خراپن .

إبن عمر رضي الله عنهما فەرمووی : هەموو بیدعەیەک گومڕاییە ئەگەر خەڵکیش واییبینن کە چاکە.

**السنة لـ محمد بن نصر المروزي : ٨٣**

وە بە سەحیحی لە رسول الله ەوە ﷺ هاتووە کە ئەفەرمووێت هەموو بیدعەیەک گومڕاییە، وە هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگردایە .

وە کاتێک کەسێک نامەیەک بۆ ئیمامی الأوزاعي ئەنووسێت و لە نامەکەدا پرسیاری لێ ئەکات : ئایا بەڕاستی تۆ ئیمانداریت؟

ئیمامی الأوزاعي لە وەڵامدا ئەڵێت : ئەو بابەتەی پرسیاری لەبارەوە ئەکەیت #بیدعە یە (إن المسألة عما تسأل عنه بدعة) . . . هەتا کۆتایی نامەکە .

واتە ئیمامی الأوزاعي یەکەم شت بەکاریهێنا بۆ ڕەخنەگرتن و بەتاڵکردنەوەی پرسیارەکەی بریتیبوو لەوەی کە بە کابرای وت : (ئەو بابەتەی تۆ پرسیاری لەبارەوە ئەکەیت #بیدعە یە).

واتە بیدعە شتێکی خراپ و بێزراوە بۆیە ئیمامی الأوزاعي بەوە ڕەخنەی لە کابرا گرت، بەڵام هەمیشە ئەهلی بیدەع لە هەوڵی ئەوەدان بڵێن کە بیدعەی حەسەنە هەیە !

ئاخر ئەگەر ئەوان تێبگەیشتیانە لە بیدعە داهێنان لە دیندا ئەوە هەرگیز ئەو قسەیەیان نەئەکرد، چونکە وشەی بیدعە لە دیندا خۆی خراپە، واتە تۆ ئەڵێیت فڵانە شت کوفرە، یان فڵانە شت شیرکە، ئایا ئەکرێت کەسێکی تر لەولاوە بڵێت : کاکە ئەمە کوفری حەسەنە یان شیرکی حەسەنەیە !

بێگومان ئەوکاتە قسەی کابرا ڕەتئەکەیتەوە، جا بیدعەش بە هەمان شێوەیە، بیدعە داهێنان لە دیندا لە ئەسڵدا خراپە، ئەگەر تەماشای وەڵامەکەی ئیمامی الأوزاعي رحمه الله بکەیت ئەم ڕاستیەت بۆ دەرئەکەوێت.

بەڵام ئەم ئەشعەریە جەهمیەکان وەک چۆن لە بابەتی ئەسماء و سیفاتدا دینیان گۆڕی و تەحریفیان کرد بە هەمان شێوە لە بابەتی عیبادەتەکاندا بە کەیفی خۆیان بیدعە دائەهێنن و ئەڵێن بیدعەی حەسەنەیە! لە کۆتاییدا وای لێ دێت واز لە هەرچی سوننەت هەیە ئەیهێنن بۆ بیدعەکانیان .

**٣٠** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي پالقبوري لە کتێبی **(المولد الشريف : ص - ١٧)** دەربارەی ئاهەنگ گێڕان (مەولودنامە) بەهۆی لەدایکبوونی رسول الله ﷺ ئەڵێت : (ئەزانم بیدعەیە، لەبەر ئەوەی لە هیچ یەکێک سەلەفەوە لەو سێ سەدەیەی پێغەمبەر ﷺ بە چاکە و خێر وەسفی کردوون نەهاتووە، بەڵام بیدعەیەکی حەسەنەیە) .

وە ڕووی ڕەشی خۆیان زیاتر دەرئەخەن بە هێنانەوەی بەڵگە بۆ شەرعاندنی ئەم بیدعەیە، دێن شتێک لە قورئان یان فەرموودە ئەهێنن

و بە تێگەیشتنە پوچەکەی خۆیان تەحریفی ئەکەن تەنها بۆ ئەوەی شەرعیەت بدەن بە بیدعەیەکەیان .

وە ئەڵێت : (إبن حجر العسقلاني بەڵگەی هێناوەتەوە بەوەی کە بیدعەیەکی حەسەنەیە) .

ئەم قسەیەی بیدعەچییەکان (واتە بیدعەی حەسەنە) کردوویانە بە هۆکارێک بۆ کردنی هەوا و ئارەزوو و گومڕایی خۆیان بە دین .

هەر شتێکیان حەز لێبوو ئەیکەن و ئەڵێن بیدعەی حەسەنەیە، لە کۆتاییدا ئەوەندە بیدعە دائەهێنن سوننەت لە ناویاندا نامێنێت و بیدعە جێگەی سوننەت ئەگرێتەوە .

لە کۆتاییدا هەندێ وتەی الهيتمي دائەنێم دەربارەی إبن تيمية و إبن قيم، لەبەر ئەوە نا کە ئەهلی سوننەیان بزانم بەڵام لەبەر دوو هۆکار کە دواتر إن شاء الله ڕوونی ئەکەینەوە :

**٣١** - إبن حجر الهيتمي الأشعري الجهمي القبوري ئەڵێت کە : (إبن تيمية و إبن قيم هەوا و ئارەزووی خۆیان کردووە بە خوای خۆیان) .

وە پێیان ئەڵێت : (مولحید) .

وە کاتێک إبن قیم و شێخەکەی ئەڵێن الله شوێنی هەیە و لەسەر عەرشە کە عەقیدەی سەلەفە رحمهم الله، الهیتمي پێیان ئەڵێت : (قبحهما الله وقبح من قال بقولهما) .

وە ئەڵێت : (ئەم قسەیەی کردوویانە لەلای زۆرێک لە زانایان کوفرە)

.

وە دەربارەی إبن تیمیة ئەڵێت : (بەندەیەکە کە الله تعالى گومڕا و کوێر و سوک و زەلیلی کردووە) .

وە دەربارەی ئەڵێت : (بیدعەچیەکی گومڕای گومڕاکەری جاهیلی زیادەڕەوە) .

وە لەبەر ئەوەی إبن تیمیة مواقەفەی سەلەفی کردووە و ئەڵێت الله عز وجل دەست وە قاچی هەیە، الهیتمي پێی ئەڵێت : (زۆربەی زانایان تەکفیریان کردووە، الله شوێنکەوتووانی ڕسوا بکات) .

بێگومان الهیتمي الجهمي بۆیە لەسەریان توونده چونکە له بابەتی ئەسماء و سیفاتدا لەسەر عەقیدەی سەلەف ن و بەو شێوەیە سیفاتەکانی الله عز وجل جێگیری ئەکەن کە سەلەف جێگیریان کردووە .

بەڵام لەبەر ڕەددانەوەیان بۆ ئەشعەریەکان و ناوبردنیان بە جەهمی و مولحید بەم شێوەیە الهیتمي لێیان هار بووە .

هۆکاری هێنانی ئەم وتەیانەی الهیتمي الجهمي :

١ - بەشێک لەو کەسانەی اللّٰه عز وجل کوێری کردوون لە ئاست حەقدا ئەڵێن (الهیتمي و هاوشێوەکانی عوزریان هەیە و ئیقامە حوججە نەکراون ! ) .

دیارە کە ئەم جۆرە کەسانە کەلامی اللّٰه عز وجل و فەرموودە و ئەو هەموو کتێبەی سەلەف بە ئیقامە حوججە نازانن، ئایا ئەو هەموو کتێب و ڕەددانەوەیەی إبن تیمیة و إبن قیم نەبوون بە ئیقامە حوججە؟ تەنانەت إبن تیمیة پاش ڕەددانەوەیان بە قورئان و سوننەت و ئاثاری سەلەف چووە خۆی فێری جەهلی کەلام کردووە بۆ ئەوەی بەڵگە کەلامیەکانیان بە جەهلی کەلام هەڵبوەشێنێتەوە وە ئەم کارەشی موخالەفەی ئەوەیە کە سەلەف رحمهم اللّٰه لەسەری بوون، ئایا ئەم هەموو ڕەددانەوەیە بە قورئان و فەرموودە و ئاثاری سەلەف، وە بە جەهلی کەلام نەبووە هۆکارێک بۆ نەمانی عوزر بە جەهل و ئیقامە حوججەیان؟

بێگومان لەلای سەلەف رحمهم الله کەسانی وەکو الهیتمي الجهمي ڕاستەوخۆ تەکفیر ئەکرێن .

لەلای ئێوەی دڵکوێریش پاش جێگیربوونی دەیان کوفر لەسەریان هێشتا بەو کەسانەی تەکفیریان ئەکەن ئەڵێن خەواریج و حەمدانی و زیادەڕەو و . . . تۆبە بکە پێش ئەوەی بەم ئیمانەوە (ئەگەر مابێتت) بگەڕێتەوە بۆلای الله عز وجل .

٢ - ئەگە لە الهیتمي الجهمي تووند نەبوویت، یاخود بە موسوڵمانت داناوە پێش ئەوەی تەکفیر و تەبدیع و بەگومڕادانانی الهیتمي ببینیت بۆ إبن قیم و إبن تیمیة، وە پاش ئەم هەڵوێستەی الهیتمي ڕات گۆڕاوە دەربارەی و بە کافری ئەزانیت، ئەوە خۆت گومڕای عەیارە بیست و چواریت، چونکە ئەوە چەندین جارە چەندین کوفر و جەهمیەت و زەندەقە و گومڕایی الهیتمي الجهمي ئەخوێنیتەوە کەچی هێشتا ئەڵێیت عوزری هەیە و موسوڵمانە، بەڵام پاش بینینی وتەی الهیتمي لەسەر ئەو کەسانەی کە لە سەلەف زیاتر دەمارگیریت بۆیان هەیە هەڵوێستی گۆڕا، ئەوە بزانە لە درۆزنێک زیاتر هیچی تر نیت، چونکە ڕێز لە مەنهەجی سەلەف ناگریت و بەلاتەوە گرنگ نییە موخالەفەی بکرێت، بەڵام ئەوەت

بەلاوە گرنگە قسە بووترێت بە چەند کەسێک کە لە ئەسڵدا لە چەند بابەتێکدا لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە لایانداوە .

کوفر و گومڕاییەکانی الهیتمي زۆر زیاترە لەوەی کە ئێمە هێنامان، ئەوەی بەوەندەی هێناومانە باوەڕ نەکات ئەوە بەوەندەی کە نەشمانهێناوە هەر باوەڕ ناکات .

https://t.me/salafyummat

https://t.me/ktebakany_salaf_kurdy

https://t.me/jami3mutun

https://t.me/salaflibrary

https://t.me/atharisalaf

https://t.me/Ktebxanay_salaf1

https://t.me/imamakany_kufr

https://t.me/Abu7anifa_u_ahliraiy

https://t.me/Hamam_alathari

https://t.me/fergaySU